# حوكمی مامەڵە و فرۆشتنەكان

## لە گەڵ سەربازانی
## طاغوت و حربییەكان

نوسینی

أبو همام

ثبته الله تعالى


پێگەی

نهاوند

NAHAWAND

# پێشەكی

الحمدلله معز الإسلام بنصره ومذل شرك بقهره ومصرف الأمور بأمره ومستدرج الكفار بمكره، الذي قدر الأيام دولا بعدله، وجعل العاقبة للمتقين بفضله، والصلاة والسلام على من اعلى الله منار الإسلام بسيفه؛.

أما بعد:

الله جل جلاله دەفەرموێت:(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَىٰ أَوْلِيَاءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ)[المائدة/٥١] واتە: ئەی ئەوانەی كە ئیمانتان هێنانەوە، نەكەن دۆستایەتی یەهود و نەصارا بكەن، چونكە ئەوانە بەشێكیان دۆست و پشتیوانی بەشێكی تریانن لە خۆیان، جا گەر بێتوو كەسێ لە ئێوە دۆستایەتی و پشتیوانیان بكات ئەوا لەوانە، بەڕاستی الله تعالی هیدایەتی گەلی زاڵم نادات؛ بەڵێ ئەم باسە باسێكە كە چەندان گەل بەهۆیەوە تیاچوون و زەرەرمەندی ئاخیرەت بوون و چەندان كەس بە مەبەستی چاكەوە هەڵی بژارد بەڵام بەدوڕاوی لێی دەرچوو، بەڵێ ئەمڕۆكەش بەشێكی ئەو باسە بەسەر زۆر كەسدا زاڵ بووە و كەوتونەتە ناوی بێ ئەوەی هەست بەخۆشیان بكەن هەڵی گەڕاندونەتەوە،(پەنادەگرین بە الله تعالی) دەرەنجامی وازهێنان لە جیهاد و زاڵ بوونی زەلیلی بەسەر موسڵمانان ڕۆژگارێكی سەخت و پڕ لە گێژاوی فیتنەی كوفر و شیرك و فەساد وڵات و شار و شەقام و ماڵەكانی تەنیوە بەشێوەیەک زۆریان لەگەڵی دا بە هیلاک چوون تەنها كەمێكیان نەبێ الله تعالی ڕەحمی پێ كردوون و سەلامەتی كردوون بە فەزڵی

خۆی لەم گێژاوە پاراستوونی؛ بەڵێ یەکێ لەو گێژاو و فیتنەیەی ڕووی لەم خەڵکە کردوە بریتیە لە شاراوەیی بونی ئەحکامەکانی فرۆشتن و مامەڵەکردن و کەوتنە هەڵەیان تێیدا، بەشێوەیەک کەم دڵ هەیە بتوانێ لەم باسە ئەم ڕاستیە هەڵگرێ گەرنا زۆرینەیان شیطان کارە خەراپەکەیانی بۆ ڕازاندونەتەوە لە بەرگی دینەکەیان و پاشان لەبەرگی خۆشی و ڕازاوەیی دونیادا، جا بزانن کەسی هۆشیار کە هەموو هەوڵێکی بۆ ئاخیرەتە و پشت هەڵکردنە لە دوونیای فانی بەدوا داچون دەکا و خۆی دەپارێزێ و تەقوای الله تعالی دەکات، سا بەڵکو لە عیبادەتەکانی هەر شەقاوەت و ماندوێتی بۆ نەمێنێتەوە، چونکە دەزانێ دونیا و ئەوەشی لەنێوی دایە زۆر بێ نرخە لای الله تعالی وە بەڵکو بۆ خۆشی، گەر بێتوو لەم دونیایە بەم ڕاستیە شاد بوبێت و دونیای ناسیبێ، بەشێوەیەک مصلحە و مفسدەی ئاخیرەت بەهۆش خۆی هێنابێتەوە، نەوەک مصلحە و مفسدەی دونیا گومڕای کردبێ، جا بە پشتیوانی و یارمەتی الله تعالی ئەم باسە وەک و واجبێک لەسەرمان ڕاستیەکەی دەخەینە ڕوو بۆئەم کەسانە لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، داواکارین لە الله سبحانە وتعالی بەجێهانانی ئەم واجبەمان لێ قەبوڵ بکات و برای بچوکیشتان لە دوعای خێر بێ بەش مەکەن.

**والحمدلله رب العالمين**

## گرینگیەتی زانینی ئەحکامەکانی چۆنیەتی فرۆشتن

بزانە خۆی فێربوون و تێگەشتن بە شێوەیەکی گشتی لە هەموو باسەکاندا فەرضە، هەر وەک و رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت : (داواکردنی عیلم فەرضە لەسەر هەموو موسڵمانێک)[ إبن ماجه/٢٤٤]، وە ئەم بابەتەی کڕین و فرۆشتن لە بابەتی عقیدەوە بیگرە تا دەگاتە ئەحکامە فقهیەکانی تێگەشتن و زانین لێی فەرضی عەینە لە سەر هەموو فرۆشیارێک، هەر وەک و چۆن دەبیینین پێشینی ئەم ئومەتە توند بوونە لەسەر ئاگادارکردنەوە و هاندانی موسڵمانان لەو بابەتە، لەوانە وەکو ترمذی کە لە ئیمامی عومەر رضي الله عنه ڕیوایەت دەکات کە دەیفەرموو:(کەس لەبازاڕەکانی ئێمە فرۆشتن نەکات جگە لەو کەسەی کە لە دین تێگەیشتووە)[سنن الترمذي ٦١٥/١]، وە ئیمامی مالك لە موطأکەی دا هێناویەتی کە ئیمامی عومەر ڕێگری لە عەجمەکان دەکرد لەوەی جل و بەرگ بفرۆشن چونکە دەیفەرموو: نابێ عەجەم لە بازاڕەکانی ئێمەدا فرۆشتن بکەن، چونکە ئەمانە لە دین تێنەگەیشتوون، وە لە تەرازوو کێشانیش دا بەچاکی پێی هەڵناستن[موطأ مالك:٢٨٣]، وە "پیاوێ هاتە لای ئیمامی علی رضي الله عنه و پێی فەرموو: ئەی ئیمام دەمهەوێت بازرگانی بکەم، ئیمامی علی پێی فەرموو: لە دین تێبگە پێش ئەوەی بازرگانی بکەی، چونکە هەرکەسێ بازرگانی بکات بەر لەوەی تێبگات ئەوە دەکەوێتە ناو ڕیباوە و دوبارە ئەکەوێتەوە ناوی" [الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي ١/١٧٢]

گێڕانەوەی زۆر هەیە لە پێشینان لەم بابەتە، وە گەر وورد ببینەوە لێی ئەبینین کە زیاتر لەسەر ئەحکامەکانی مامەڵە کردندا لێدوانیان داوە و بەم شێوەیە لەسەری توند بونە و ئاگاداریان لەبارەیەوە داوە، کە نەزانین و هەڵە کردن تێیدا تاوانە بەم شێوەیە توند بوونە لەسەری، ئەی چی بۆ ئەو بابەتەی کە لەبەر دەستمانە کە پەیوەندی بە بنچینە و واجباتەکانی دینەکەمانەوە هەیە، کەوا زۆر لەپێشتر و پێویست ترە فێربون و ئاگادار بون و ڕەچاو کردنی، نەکا بەهۆی هەڵەیەک بەهۆی بێ ئاگایی و نەزانینێکەوە لەم باسە دینەکەمان لەدەست بدەین و دەربچین لە دین - پەنا دەگرین بە الله تعالى و داوای سەلامەتی لێ دەکەین لە کوفر و شیرک- هەر وەک و الله سبحانه وتعالى دەفەرموێت:(فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ)[محمد/١٩] بە فەرمان فەرمانمان پێ دەکات بەوەی دەست بە زانین و فێربونی لاإله إلا الله وە بگرین، گەرنا نەزانین و پشتگوێ خستن سەرەنجامێکی پڕ لە ئازاری هەیە . پەنادەگرین بەالله تعالى لێی.

## حوکمی کڕین و فرۆشتن لە گەڵ کافر اندا

کڕین و فرۆشتن لە بنچینەدا حەڵاڵە جا موسڵمان لەگەڵ موسڵمانی بکات یان موسڵمان لەگەڵ کافردا بیکات، هەر وەک و الله سبحانه وتعالى بە ڕەهایی و گشتی دەفەرمویت:(وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ)[البقرة/٢٧٥] واته: الله جل جلاله فرۆشتنی بۆتان حەڵاڵ کردوە، وە لە هەردوو صحیحەکەوە هاتووە لە دایکە عائیشەوە(رضي الله عنها) دەفەرموێت: رسول الله صلى الله عليه وسلم خواردنی لە یەهودییێک کڕی بە نەسیئە و ڕەهنەکەشی درعێک بوو؛[صحيح البخاري/٢٠٩٦ - صحيح المسلم/١٦٠٣] نەوەوی لە شەڕحی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێت:( گشتی موسڵمان لەسەر ئەوەن کە جائیزە مامەڵە لە گەڵ ئەهلی ذیممە و جگە لەمانیش لە کافراندا بکرێت گەر هیچ حەرامێتیەک لەوەی لایانە نەهاتبێتە جێ)[شرح صحيح المسلم ٤٠/١١] وە بوخاری دەگێڕێتەوە لە فەرمودەی عبدالرحمنی کوڕی ابی بکر (رضي الله عنهما) دەڵێت:(ئێمە لە گەڵ رسول الله صلى الله عليەوسلم دا بووین پاشان پیاوێکی موشریک هات بە مەڕەوە دەیفرۆشت، رسول الله صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: دەیفرۆشی یان دەیبەخشی؟، ئەویش ووتی: نا دەیفرۆشم، مەڕێکی لێ کڕی)[بخاري/٢٢١٦] هیچ یەکێ جیاوازی نییە لەم باسەدا لە جائیزیەتی کڕین و فرۆشتن لە گەڵ کافردا، جا ئاشتی خوازبێ یان شەڕانگێز و محارب بێ، هەروەک و ابن تيميه دەڵێت:(پاشان گەر کەسێ سەفەری کرد بۆ وڵاتی حرب بۆ ئەوەی شتیان لێ بکڕێ جائیزە لە لای ئێمەدا، هەر وەک و فەرمودەی بازرگانی ابو بکر لەم بارەیەوە بەڵگەیە لە سەردەمی ژیانی رسول

الله صلى الله عليه وسلم دا کاتێ دەچوو بۆ شام، کەوا دار و وڵاتی حرب بوو)[اقتضاء الصراط المستقيم ١٥/٢] لێرەدا بەشێوەیەکی مطلق و گشتییە، بەڵام ئەم باسە مقید و سنوردارێکی بۆ هەیە کەوا لە باسەکانی تر دەچینە سەری ان شاءالله تعالى

## حوکمی فرۆشتن بە کافری محارب

لە پێشدا باسمان لەوە کرد کە ڕێگادراوە کڕین و فرۆشتن لە گەڵ جەنگاوەر و محارب دا بکرێت و حوکمی هەروەک و کافری ئاشتیخوازە، بەڵام شتێ هەیە ئەم باسە جیا دەکاتەوە و مقید و سنورداری دەکات، ئەویش بریتیە لەو پێ فرۆشتنەی کەوا یارمەتی دانی کافرانە بەسەر موسڵمانان، واتا هەر کەل و پەلێک کە بفرۆشرێت بە کافری محارب و بزاندرێت سوود لەم کەلوپەلە وەردەگرێت بە جۆرێک لەجۆرەکان بۆ دژایەتی و جەنگی موسڵمانان.

جا باسەکە لێرەدا زۆر مەترسیدارە بەشێوەیەک هەر کەسێک بکەوێتە ناو ئەم کارەوە، هەمان حوکمی یارمەتیدراوەکەی هەیە، واتا کەسێ کافرە و لەپێناو پاراستنی حوکمێکی طاغوتی دەجەنگێ یارمەتی دەرەکەی لە هەرشتێک بێ هاوبەشی جەنگانەکەیەتی لەگەڵ موسڵمانان و لەو حاڵەتەشدا کوفرێکی گەورە و ئاشکرایە کە بەهۆیەوە لە میلەت دەردەچێ

[پەنادەگرین بە الله تعالى] هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت:(يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ)[المائدة/٥١] واتە: ئەی ئەوانەی كە ئیمانتان هێنانەوە، نەكەن دۆستایەتی یەهود و نەصارا بكەن، چونكە ئەوانە بەشێكیان دۆست و پشتیوانی بەشێكی تریانن لە خۆیان، جا گەر بێتوو كەسێ لە ئێوە دۆستایەتی و پشتیوانیان بكات ئەوا لەوانە، بەڕاستی الله تعالى هیدایەتی گەلی زاڵم نادات؛ جا ئیمامی طبری لە تفسیری ووتەی الله سبحانه وتعالى(وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ) دا دەڵێت: " هەر كەسێكە دۆستایەتی و پشتیوانی یهود و نەساڕا بكا لە جگە لە ئیمانداران، جا ئەوەی دۆستایەتیان بكات و سەریان بخات بەسەر موسڵماناندا ئەوا لە ئەهلی میلەت و دینەكەی ئەوانە" وە دەڵێت: " هەر كەسێ دۆستایەتی و پشتیوانیان بكات ئەوا جەنگی لەگەڵ الله تعالى و رسولەكەی صلى الله علیه وسلم و ئیمانداران كردوە"؛ (أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ) بەڵێ ئەوانە بەشێكیان دۆست و پشتیوان و یارمەتی دەری بەشەكەی تریانن، جا هەر كەسێكیش لەگەڵیان دا بێ لە هەر شتێكدا كە ببێتە پشتیوانی و یارمەتی بۆیان لەسەر موسڵمانان ئەوا بەشێكە لەو بەشەیان كە الله سبحانه وتعالى باسی كردوە و پێمانی ڕاگەیاندوە.

وە الله جل جلاله دەفەرموێت:(تَرَى كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ - وَلَوْ كَانُوا

يُؤْمِنُونَ بِالله والنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاء وَلَكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ)[المائدة/٨٠-٨١] واتە: دەبینی زۆرێک لەوانە دۆستایەتی و پشتیوانی کافرانیان کردوە، کەوا نەفسی خۆیان بۆ شتێکی زۆر خەراپ پێش خستووە بەهۆیەوە تورەیی الله تعالی یان بەسەرەوەیە و لە سزاشدا بۆ تاهەتایی دەمێننەوە لەناویدا - خۆ گەر ئەمانە بەڕاستی ئیمانیان بە الله تعالی و پێغەمبەرەکەی و وە ئەوەشی کە بۆی دابەزیوە هەبوایە ئەوا هەرگیز ئەمانەیان بە دۆست و پشتیوان نەدەگرت، بەڵام زۆرینەیان لە حەق لایانداوە؛ جا هەر وەک و ئەم قاعیدەیەی اصولی تفسیر کەوا دەڵێت:(عیبرەت بە گشت و عامی شێوە دەربڕین و لەفظەکەیە نەوەک و بە تایبەتمەندی هۆکاری دابەزینەکەی)

وە الله سبحانە وتعالی دەفەرموێت:(لاَّ يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاء مِن دُوْنِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللّهِ فِي شَيْءٍ)[ال عمران/٢٨] واتە: نابێت ئیمانداران کافران بکەن بەدۆست و پشتیوان لە جگە لە ئیمانداران، جا گەر کەسێ وا بکات هیچ شتێکی لەلای الله سبحانە وتعالی وە نامێنێت؛ جا ئیمامی طبری لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێت: "وەمانای ئەوەیە: ئەی ئیماندار کافر بە پشتیوان و سەرخەر مەگرە، دۆستایەتیان لەسەر دینەکەیان و پشتیوانی کردنیان لەسەر موسڵمانان لە جگە لە ئیمانداران، جا ئەوەی وابکات ئەوا هیچ شتێکی لەلایەن الله تعالی وە بۆ نامێنێتەوە، واتا بەریئە لە الله تعالی، وە الله تعالی بەریئە لێی بەو هەڵگەڕنەوەی لەدینەکەی و کەوتنە ناو کوفری"

وە هەروەها دەفەرموێت:(وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۖ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)[المائدة/٢] واتە: هاوکاری و یارمەتی بکەن لەسەر چاکە و تەقوا، وە نەکەن هاوکاری و یارمەتی بکەن لەسەر تاوان و دەستدرێژی، تەقوای الله تعالى بکەن بەڕاستی تۆڵەی الله تعالى زۆر توندە؛ الله سبحانە وتعالى فەرمانمان پێ داکات یارمەتی و پشتیوانی یەکتر بکەین لەسەر کاری چاکە و تەقوا و ڕێگری و قەدەغەمەان دەکات لەوەی یارمەتی و پشتیوانی یەکتر بکەین لەسەر تاوان و دەستدرێژیکردن وە نەک هەر ئەوەندە بەڵکو ئاگادارمان دەکاتەوە بەوەی نەکەوینە ئەم کارەوە چونکە سزا و تۆڵەیەکی زۆرتوندی لەسەر هەیە[پەنا دەگرین بە الله تعالى]، جا لە باسی یارمەتی و هاوکاری کردن لەسەرتاوان بەم شێوەیە قەدەغە و ڕێگری لێ کرابێ و هەڕەشەی لەسەر بێ، ئەی بۆ هاوکاری و یامەتی کوشتاری موسڵمانان و ڕێگری لە حوکمی الله تعالى و سەرخستنی طاغوتان و حوکمەکەیان دەبێ حوکم و هەڕەشە و سزای چی لەسەر بێ[پەنا دەگرین بە الله تعالى] وە هەندێ لە زانایان ئەم ئایەتەیان بە لێکدانەوەی هاوکاری و یارمەتی کوفر و زوڵم تفسیر کردوە و باسیان لێو کردوە، هەر وەک و بغوی دەڵێت: " (وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) دەوترێت کە ' الإثم ' بە مانای کوفر دێت، وە 'العدوان' بەمانای زوڵم و ستەم دێت"[تفسير البغوي]

وە هەروەها الله تعالى دەفەرموێت:(فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَافِرِينَ)[القصص/٨٦] واتە: مەبن بە پشتیوان بۆ کافران؛ وە هەروەها رسول الله صلى الله عليه وسلم لەعنەتی لە مەی کردوە دە جار: لەعنەت لە مەی وە لەو کەسەی کە

دەیگوشێ وە لەو کەسەی کە بۆی دەگوشرێت وە لەو کەسەی کە هەڵی دەگرێت وە لەو کەسەشی کە بۆی هەڵدەگیرێ وە لە فرۆشیارەکەی وە لەو کەسەشی کە بۆی دەفرۆشرێت وە ئەو کەسەی کە دەیگێڕێت وە ئەو کەسەی کە دەیخواتەوە وە ئەو کەسەی لە قازانجەکەی دەخوات؛ ئەمەش بەڵگەیە بۆ هاوبەشی هاوکار ویارمەتی دەرەکانی لە بنچینە و فرعی باسەکەدا.

الله تعالى نەک هەر تەنها لەسەر موسڵمانانی قەدەغە کردوە کە هاوکاری و یارمەتی کافران بدەن لەسەر موسڵمانان، بەڵکو قەدەغەی ئەو کافرانەشی کردوە کە خاوەن پەیمان بونە لە گەڵ موسڵمانان، کە نابێت هاوکاربن و یارمەتی جەنگاوەرانی دژ بە موسڵمانان بدەن، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت:( إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدتُّم مِّنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ)[التوبة/٤] واتە: جگە لەو موشریکانە نەبێ کە پەیمانتان لەگەڵیاندا هەیە و پەیمانەکەیان هەڵنەوەشاندۆتەوە وە هاوکارنەبونە و یارمەتی هیچ یەکێکیشیان نەکردوە لەسەرتان ئەوا ئێوە پەیمانەکەتان تەواو بکەن لەگەڵیان تا ماوەی خۆی، بەڕاستی الله تعالى موتەقیانی خۆشدەوێت؛ بەڵێ ئەم باسە بەم شێوەیە گرینگی پێدراوە و ئاگاداری و هۆشیاری لەسەر دراوە هەتتا بۆ کافریش نییە شتی وابکات، خۆ گەر وابکات ئەوا حوکمی کوشتنی بۆ هەیە، وە نەک هەر ئەوەندە بەڵکو الله تعالى لۆمەی ئیمانداران دەکات کە ئەو کەسانەیان نەکوشتوە، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت:(أَلَا تُقَاتِلُونَ

قَوْمًا نَّكَثُوا أَيْمَانَهُمْ وَهَمُّوا بِإِخْرَاجِ الرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ)[التوبة/١٣] واتە: ئەوە بۆچی كوشتاری گەلێک ناكەن كە پەیمانەكەیان هەڵوەشاندۆتەوە و كەوتونەتە هەوڵدان بۆ دەركردنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئەوان دەستپێشخەر بوون سەرەتا، ئایا لێیان دەترسن؟ ئا بزانن الله تعالی بە حەق ترە لەوەی لێی بترسن گەر ئێوە ئیماندارىن؛ جا هەر وەک و ڕوونە لە گەورەترین مەرجی پوچەڵ بونەوەی پەیمان ئەوەیە كە هاوكاری و یارمەتی كەسانێ بدەیت لە سەر موسڵمانان هەر وەک و الله تعالی بەهۆی گەورەیی ئەم باسە ئەم بابەتەی بەجیا باس كرد لە گەڵ هەڵوەشاندنەوەی پەیمان.

وە نەک هەرئەوەندە بەڵكو ڕێگری كراوە لە خاوەن پەیمانی كافر كە یارمەتی كەسانێكی تری كافربدا كە جەنگیان لە گەڵ هاوپەیمانی موسڵمانان هەیە گەرچی كافریش بن، هەر وەک و قوڕەیش یارمەتی و هاوكاری بەنو بكریان بە چەک دا لەسەر خزاعە، كە ئەمە هۆكاری سەرەكی هەڵوەشانەوەی پەیمانی قوڕەیش بوو و هۆكاری هەڵگیرسانی جەنگ بوو لە گەڵیاندا، بەڵێ ئەم باسە بەم شێوەیە بەرز نرخێندراوە و گرینگی پێدراوە بەشێوەیەكی زۆر توند ڕەتی ئەوە دەكرێتەوە كە هاوكاری و یارمەتی كەسانێک بدەن كە هاوپەیمانی موسڵمانانن گەرچی كافریش بن.

وە زانایان بێ بەش نەبونە لە باس كردنی ئەم بابەتە و بە گرینگ دانانی، بەڵكو زۆر توند بونە لەم باسەدا، پرسیار لە ابن تیمیە -رحمە الله- دەكەن:

مامەڵە کردن لە گەڵ تەتاردا، ئایا ئەمە ڕێپێدراوە بۆ ئەوکەسەی کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات؟

وەڵامی ئەداتەوە و دەفەرموێ:( جائیز تێیدا هەروەک و جائیزێتیە بۆ هاوشێوەی ئەمانە، وە حەڕامییێتی هەروەک و لەسەر حەڕام بونی هاوشێوەیانە، جائیزە پیاو لە مەڕو ماڵاتیان بفرۆشێت وە لە ئەسپەکانیان لەم بابەتانە، هەر وەک و چۆن لە مەڕوماڵات و ئەسپی تورکمان و عەرەب و کوردەکان دەفرۆشرێت، وە جائیزە خواردن و پۆشاک و هاوشێوەی ئەمانەیان پێ بفرۆشرێت، هەر وەک و چۆن بۆ هاوشێوەی ئەمانە جائیزە، بەڵام گەر بەوانیان فرۆشت یان بە جگە لەوانیان فرۆشت لەو شتەی کەوا یارمەتیە بۆیان لەسەر حەڕامەکان، وەک و ئەسپ و چەک، کەوا کوشتاری حەڕامی پێ دەکەن، ئەوەیان جائیز نییە، الله تعالى دەفەرموێت:(وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ)[مائدة/٢] وە لە سونەندا هاتووە، لە رسول الله وە صلى الله عليه وسلم (کەوا لەعنەتی لە مەی کردوە دە جار: لەعنەت لە مەی وە لەو کەسەی کە دەیگوشێ وە لەو کەسەی کە بۆی دەگوشرێت وە لەو کەسەی کە هەڵی دەگرێت وە لەو کەسەشی کە بۆی هەڵدەگیرێ وە لە فرۆشیارەکەی وە لەو کەسەشی کە بۆی دەفرۆشرێت وە ئەو کەسەی کە دەیگێڕێت وە ئەو کەسەی کە دەیخواتەوە وە ئەو کەسەی لە قازانجەکەی دەخوات) وە ابن بطال -رحمه الله- دەڵێت: " مامەڵە کردن لەگەڵ کافراندا جائیزە جگە لەو مامەڵەیە نەبێت کە دەبێتە هاوکاری و یارمەتی بۆ محاربەکان بەسەر

موسڵمانانەوە "[فتح الباري٤/٤١٠] وە دەڵێت: " کڕین و فرۆشتن لە گەڵ کافراندا بە هەموویان جائیزە تەنها بە محاربەکان نەبێ لەو شتەی کە هاوکاری و یارمەتیە بۆیان لەسەر لەناوبردنی موسڵمانان لە ئامادە سازی و چەک و وەلەو شتانەشی کە پێی بەهێز دەبن"[شرح البخاري١٣/٣٥]

سرخسي -رحمه الله- دەڵێت: " ڕێگری لە بازرگان ناکرێت لە چونە ناو وڵاتی حرب بە کەلو پەلی بازرگانی، چەک و سواری ئەسپی لێ دەرچێ چونکە بەمانە پێی بەهێز دەبن لەسەر کوشتنی موسڵمانان، ڕێگری دەکرێت لە هەڵگرتن بۆیان وە بەهەمان شێوە ئاسن، چونکە ئەصل لە ئاسن دا چەکە هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت:{وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ} "[المبسوط للسرخسي١٠/١٥١]

ابن عبدالبر -رحمه الله- دەڵێت:" ڕێگری لە فرۆشتنی هەموو شتێ دەکرێ کە بزاندرێت تێیدا هێز دروست دەبێت بۆیان لەسەر موسڵمانان جا لە چەکە یان ئەسپ یان زینی سواری بێ یان نەوت و ئاسن لەوانەی کە وەک و چەکێک بەکار دێن وە هەموو ئەوانەی کە ئامادە سازی پێدەکرێت لە ڕێژەی جەنگدا "[الكافي في فقه أهل المدينة ١/٤٨١] وە ئیمامی نووی -رحمه الله- دەڵێت:" موسڵمانان کۆدەنگ لەسەر جائیزێتی مامەڵە کردن لە گەڵ ئەهلی ذیممە، وە جگە لەوانیش لەکافران مادام هیچ حەڕامێک لە مامەڵەکەدا نەهاتبێتە جێ، بەڵام جائیز نییە بۆ موسڵمان چەک و پێداویستیەکانی جەنگ بفرۆشێت بە محاربەکان، وە یان هەر شتێک کە هاوکاری بێت بۆیان بۆ سەپاندنی دینەکەیان "[شرح صحيح المسلم ١١/٤١] وە شێخ محمدی کوڕی

عبدالوهاب -رحمه الله- لە باسی هەڵوەشێنەرەوەكانیئیسلامدا لە هەشتەم هەڵوەشێنەرەوەدا دەڵێت:(مظاهرة المشركين ومعاونتهم على المسلمين) واتە: پشتیوانی كردنی موشریكان و یارمەتی و هاوكاری كردنیان لەسەر موسڵمانان. ووتەی زانایان لەم بارەیەوە ئێجگار زۆرە، وە كورتەی باسەكە كردمان لێرەدا ئەوەیە "كڕین و فرۆشتن جائیزە لە گەڵ كافراندا جگە لەو كەل و پەل و پێداویستیانە نەبێت كە پێی بەهێز دەبن بەسەر موسڵمانانەوە"، وە هەر كەسێک بكەوێتە ناو كارێكی وا هەمان حوكمی یارمەتی دراوەكەی هەیە{وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ}،

وە ئەم باسەش ئیجماعی ئومەتی لەسەرە، وە ئەو ووتانەی زانایان كە باسیان لێوە كردوە زیاتر لە سەر حەرامێتی كردویانە، چونكە باس لە پێفرۆشتن بە موسڵمانان دەكەن كە دژی برای موسڵمانیان دەجەنگن كە لەم حاڵەتەشدا تاوانە و هاوبەشبونە لە تاواندا، هەر وەک و عبدالرحیمی كوڕی سلیمان لە ئەشیحت كەوا لە حسنەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: " حەڵاڵ نییە بۆ موسڵمان كەوا خواردن و چەک بۆ دوژمنی موسڵمانان ببات و هەڵگرێ كەوا بەهێزیان بكات، ئەوەی وابكات ئەوا فاسقە ".لەم باسەشدا هیچ خیلافێک نییە لەسەری جگە لەو فەرمودەیەی ابو قتادە كەوا ئەمیشیان لە حاڵەتی هێز پێنەدان و یارمەتی نەدان و ڕۆژی شەڕ نەبون بوە گەرچی لەزەمەنی جەنگیش بوبێ.

## هەندێ نمونەی مامەڵە لە بازاڕەکانی ئەمڕۆدا

باس کردن و هێنانەوەی نمونەی ڕۆژگار بۆ ئەم باسە شتێکی پێویست و تەواوکەرە بۆ ئەم بابەتە دوای ڕوون بونەوەی حوکمەکە و باسکردنی دوای ئەو پێویستە حاڵەکان ڕوون بکرێنەوە إن شاءالله تعالى،چونکە دەبینی هەندێ کەس کاتێ باسی ئەحکامەکانی بۆ دەکەی هاوڕایە لە گەڵتدا، بەڵام کاتێک باسی پیشەکەی بکەی و بەدوا داچون بکەی لەگەڵیدا و پێ بڵێی ئا لێرەدا ئەم باسە لە خۆی دەگرێتەوە، هەر گوێشی پێنادا و پشت گوێی دەخا، وەک ئەوەی ئەم باسە هەر بونی نەبێ، (پەنا دەگرین بە الله تعالى لە فیتنەی خۆشویستنی دونیا بەسەر ئاخیرەتدا) جا باسکردن و نمونە هێنانەوەی هەندێ لە پیشە باوەکانی ئەم ڕۆژگارە کە ئەنجام دەدرێت لە ناو بازاڕەکاندا، ڕوون بونەوەی باسەکەیە زیاتر و هۆشیار کردنەوەیەکە و بەڵگە بەدەست نەهێشتنەوەیەکە بإذن الله تعالى.

### ١- مامەڵەی چەک

لەلایەن هەموو موسڵمانانەوە زانراوە و شتێکی ڕوونە و کەس نییە پێداگری لەو باسە بکات و جیاواز بێت، وەزانایان باسیان لەو مامەڵەیە کردوە لە گەڵ حربییەکان هەروەک و لە پێشدا هەندێ لە ووتەکانیانمان نقل کرد.

### ٢- مامەڵەی خواردەمەنیەکان

بابەتی خواردەمەنیەکان لەهەموویان مەترسیدارترە، چونکە لە پێشترین شتە بۆ بەهێز بونی کەسی موحاریب بەسەر موسڵمانەوە، جا لە

پێداویستیەکانی عائیلە بێت یان مەقەڕەکان هەمووی وەک و یەکە و کەسی پێشمەرگە و ئاسایش و دژە تیرۆر تێیدا هاوکاری دەکرێ و یارمەتیە بۆی و بەهێز بونیەتی، چونکە گەر بەهێزترین چەکیشیان لابێ ناتوانن شەڕی موسڵمان بکەن تا گەدەیەکی تێریان نەبێت و ووزەی خواردنیان وەرنەگرتبێت، موفتی اتباعی تابعینی مەدینە إبن الماجشون دەربارەی پێفرۆشتنی خواردن و چەک بە حربییەکان دەڵێت: " چەک بە موحاریبەکان نافرۆشرێت نە لە کاتی جەنگدا وە نە لە کاتی وەستانی جەنگدا، بەڵام خواردن تەنها لە کاتی شەڕ وەستان وئاشتیدا دەفرۆشرێت "[فقه إبن الماجشون/٤٤٤]

بەڵێ کەی یاسای چواری تیرۆر لە دەستورە گڵاوەکەی ئەم حوکمەتە نەما ودژایەتی موسڵمان نەکرا لە سەر بانگەوازی توحید و جیهاد ئەو کاتە ئاشتی خوازن و مامەڵە لەگەڵیان دەگەڕێتەوە سەر ئەصڵەکەی، وە بە هەمان شێوە لەم مامەڵەیەدا مطعەمەکان و گشت شوێنەکانی خواردنی ژەمی دەگرێتەوە.[ پەنادەگرین بە الله تعالی ]

**٣- مامەڵەی چارەسەرکردنی نەخۆشی**

پێدانی چارەسەر بە حربیەکان یان تیمار کردنیان یان پشکنین بۆ کردنیان یەکێکە لەو کارە ڕوون و ئاشکرایانە لە یارمەتی و هاوکاری کردنی حەربییەکان، چونکە گەر بێتوو لەش ساغ و تەندروست بێت بەهێزتر و بەتواناترە لەسەر بەردەوامدان بە دژایەتی کردنی موسڵمانان و سەرخستنی

طاغوتان، ئەم کارە لە دوو حاڵەتدایە کە هەردووکی دەرچونە لەمیلەت و هەڵگەڕانەوەیە (پەنا دەگرین بە الله تعالى)

یەکەم: ڕێگری کردنە لە فەرمانەکانی الله تعالى، چونکە الله تعالى فەرمانی بە کوشتنی کافر و موشریکان کردوە بە تایبەت ئەوانەی کە دەجەنگن لە گەڵ موسڵمانان، ئەوا فرض العين ە لەسەر هەموو موسڵمانێک بجەنێگێت دژی و بیکوژێت، بەڵام وانەکات و لە تاوانی دانیشتن بمێنێتەوە لە جیهاد ئەوا تاوانبارە بەڵام بگاتە ڕادەی ئەوەی کە یارمەتیان بدات بە چارەسەرکردنیان و هەوڵی لەش ساغیان بدات ئەوا پێی کافر دەبێت و لە دین هەڵدەگەڕێتەوە (پەنا دەگرین بە الله تعالى) لەم دژ وەستانەوەی فەرمانی الله تعالى، جا الله سبحانە وتعالى دەفەرموێت:(إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ)[الانفال/٣٦] واتە: ئەوانەی کە کافرن ماڵیان دەبەخشن بۆ ئەوەی ڕێگری بکەن لە ڕێگای الله تعالى.

دووەم: یارمەتی و هاوکاریە بۆیان بە وەرگرتنی چارەسەر و پشکنین کە دەبێتە هۆی دروست بونەوەی هێز بۆیان و چالاک بونەوەیان بۆدژایەتی موسڵمانان و سەرخستنی طاغوتان(پەنا دەگرین بە الله تعالى)

**٤- مامەڵەی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان**

فرۆشتنی مۆبایل و کۆمپیوتەر و چاک کردنەوەیان بۆ حربییەکان، لەم سەردەمەدا ئامێرەکانی وەک و مۆبایل و کۆمپیوتەر یەکێکن لە چەکە بەهێزەکان لە دژ وەستانەوە بەرامبەر موسڵمانان، کە بەهۆیەوە فەرمانی چەندین جەنگی پێگەیەندراوە و چەندین موسڵمان بەهۆیەوە شهید کراوە و

دەستگیر کراوەو ئازار دراوە، کە ئەمەش شتێکە لای هیچ یەکێکمان شاراوە نییە، لەڕێگای ئەم مۆبایل و کۆمپیوتەرەوە فەرمانی دەرچون بۆ جەنگیان پێ دەدرێ و پێی وەردەگرن، وە هەر لەڕێگای ئەم مۆبایل و کۆمپیوتەرەوە هەواڵی جاسوسی دەگەیەنرێتە دەزگا سیخوڕیەکان و لەسەر ئەم ئامێرانەوە چاودێری دەخەنە سەر ئامێری موسڵمانان، وە هەر لەڕێگای ئەم مۆبایل و کۆمپیوتەرەوە کاری پشتگیری کردنی طاغوتان و دژ وەستانەوەی موسڵمانان دەکرێت لە ڕێگای ڕاگەیاندن و تۆڕەکانەوە.

ڕەنگە هەندێ لە خاوەن ئەم پیشەیە بڵێن: خۆ کابرای پێشمەرگە و ئاسایش لە بەردەمی من جاسوسی نەکردوە یان فەرمانی دەرچونی وەرنەگرتوە و منیش مۆبایلیم بۆ چاک کردبێتەوە.!!

جا لە وەڵامیاندا بە دوو شێوە وەڵامیان ئەدەینەوە: یەکەم: دەپرسم جیاوازی چییە لەوەی کە لە ڕوکەشیدا دەربکەوێ ڕاستەوخۆ و لەگەڵ ناڕاستەوخۆ؟ هەردووکیان هەر دەرکەوتن نییە؟ واتا: هەر کەسێ بەرگی پۆلیسی ئاسایش پێشمەرگە .. ئەمانەی لەبەر بوو یان بەرگی مەدەنی بوو بەڵام دەتناسی چ کارەیە چ سیقەیەکت پێیتی ؟! مەگەر نازانن ئەمانە بە زۆری لەسەریانە و لە یاسایانە شەڕی موسڵمان بکەن بە چەک بە ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان بەزوبانیان بە هەموو شێوەیەک، جا چ پێویست دەکات خودی کارەکەیت پێ نیشانبدا، جا برەو دان بەم گومانانە لە فێڵ لە نەفس کردن و گومڕا کردنی زیاتر نییە.

دووەم: زانایان کە باسیان لە قەدەغەیی فرۆشتنی چەک و شتانی تر کردوە هیچیان باسی ئەو مەرجەیان نەکردوە کە ئێوە باسی دەکەن و نەیان ووتووە دەبێ دڵنیاییت وابێ نمونە ئەم چەکەی پێ بدەی لەبەردەمم ڕاستەوخۆ موسڵمانێک ئەکوژێ ئینجا دوای ئەوە پێت دا یارمەتی و هاوکاریە بۆیان.

چەکی ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان چەکێکی مەترسیدارە کە هەم بۆ جەنگی ڕوبەڕوو بونەوە بەکاردێت وە هەم لە جەنگی ڕاگەیاندن، هەرکەسێک مۆبایل یان کۆمپیوتەریان پێ بفرۆشێت یان بۆیان چاک بکاتەوە هەمان حوکمی ئەوانی هەیە لەو کارانەی کە دەیکەن بەم ئامێرە، وە بە هەمان شێوە فرۆشتنی کارتی مۆبایل و ئینتەرنێتیش دەچێتەوە سەر هەمان کار. (پەنا دەگرین بە الله تعالی)

**٥- مامەڵەی پێداویستیە پۆشاکیەکان**

فرۆشتنی پۆشاک و پێداویستیەکانی جەنگی دەبێتە هۆی بەهێز بونی سوپای کافر بە ڕێک و جوان و یەکڕیزی و ئامادەسازی و دەرکەوتنی جیا کردنەوەی لەگەڵ ئەوانەی تردا، وە هەر وەها پێخەف و هاوشێوەی ئەمانە کە حربییەکان لەسەری دەخەون و ئیسراحەتی پێ وەردەگرن و چالاک وبەهێزتر دەبن لەسەر شەڕی موسڵمانان.

**٦- مامەڵەی کاروباری خانوو**

کرێکاری کردن و بونیاد نانی خانوو بۆ حربییەکان یان پێ فرۆشتنیان هاوبەشبوونە لە کاری حربەکەیان، چونکە ئەو خانوو شوێنە نیشتەجێیەی

کە تێیدا نیشتەجێ دەبن چاکترین شوێنە بۆی بۆ ئیسراحەت کردن و چالاک بونەوە و هێز وەرگرتن.

بەڵێ گێژاوی ئەم فیتنەیە بەم شێوەیە بازاڕەکانی تەنیوە نەک هەر ئەوەندە بەڵکو بیر وهۆشی زۆرینەی کۆنترۆڵ کردوە کە حەق لەم بارەیەوە نامۆ و بەرهەڵستکار و زێدەڕە و بووە لە بیرکردنەوەیاندا و خۆشی لەسەر چاڵێکی ئاگرینە(پەنا دەگرین بە الله تعالی) زۆرینەی باسەکان کۆمەڵێ کەس گومان دروست دەکەن یان ئەوەتا تێبینیان هەیە لەسەری بەهۆی ناڕونی حاڵەکەی و حوکمەکەی لای، جا بە پشتیوانی الله تعالی ئەچینە سەر لادانی پەردەی گومانەکان و پوچەڵ کردنەوەیان، سا بەڵکو الله تعالی بیکاتە مایەی ڕێنمووی و یادهینانەوەی کەسانێک إن شاءالله تعالی.

## هەڵوەشاندنەوەی گومانەکان

الحمدللّٰه اللّٰه تعالی یارمەتی دام لەگەڕانەکەم زۆر گەڕام بەدوای گومانەکان لەم باسەدا سەبارەت بە بەڵگە و حوکمەکەی و حاڵەکان، جا لە گەڕانەکەمدا کۆمەڵێ گومانم دەست کەوت إن شاءاللّٰه تعالی لێرەدا پەردە لە سەر هەموو گومانەکان لا دەدەین.

### گومانی یەکەم:

**دەڵێن**: دایکی پێغەمبەر موسا علیه السلام وەک و خزمەتکارێکی موسا لە لەلای فیرعەون ئەندام بوو پارە و خۆراکی وەردەگرت لە بەرامبەردا، کەوایە ڕێگا دراوە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکەن.!!

**لە وەڵامیان دا دەڵێین:{مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ ۖ إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ ۖ إِنَّ اللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ}** جا ئێمە بە مطلقی و ڕەهایی نەمان ووتووە ڕێگادراو نییە لە گەڵ کافردا مامەڵە بکەی، بەڵکو ئێمە تەنها لەوەدا ووتوومانە ڕێگا دراو و نییە و بەڵگەمان خستۆتە ڕوو لە مامەڵەیەک کە هێز و توانا و هاوکاری بێ بۆ حربییێک لە حربەکەیدا، وە سەبارەت بەم باسەی دایکی موسا علیه السلام هیچ یارمەتی و هاوکاریەکی بۆ فیرعەون تێدا نییە ببێتە بە دەستتانەوە بەڵکو دەبێتە بەڵگە بەسەرتانەوە کە ئەم مامەڵەیە سودو قازانج و هاوکاری و یارمەتی بوو بۆ موسا و دایکی بێ ئەوەی فیرعەون سود مەند بێت لە هیچ شتێکدا لەو کاتەدا. جا دوای ئەم وەڵادانەوەیان ڕەنگە گومانێکی تر درووست بکەن سەبارەت بەم بابەتەوە و بڵێن: باشە خۆ خێزانی

فیرعەون بە فیرعەونی ووت چاو ڕۆشنی بۆ من و بۆ تۆ مەیکوژە سا بەڵکو سوودو کەڵکی هەبێ بۆمان، کەوایە ئەوان بۆیە دایانەوە دایکی تا بۆیان بەخێو بکات تا سود و کەڵکی بۆ فیرعەون هەبێت، ئەی کە دایکی بەخێوی کرد نەیدەزانی ئەوان بۆ مەبەستی سود و کەڵک دەیان هەوێت؟ کەوایە گەر سودیشی هەبوو بۆ محارب ئەوا هەر جائیزە.!!

لە وەڵامی ئەم لێکدانەوەیە باطڵەدا دەڵێین: بەر لەوەی خێزانی فیرعەون ئەم پێشنیار و بۆچونە بۆ فیرعەون بکات الله تعالى وەحی بۆ دایکی موسا علیه السلام کردبوو، هەر وەک و الله تعالى دەفەرموێت:(وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ أُمِّ مُوسَىٰ أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ)[القصص/٧] واتە: جا وەحیمان بۆ دایکی موسا علیه السلام کرد کە شیری پێبدات و هەرکاتێ ترسی لێی هەبوو فڕێی بداتە ناو ڕوبار و نەشترسێ و خەمیش نەخوات چونکە ئێمە بۆی دەگەڕێنینەوە و دەیکەین بە یەکێک لە پێغەمبەران؛ بەڵێ دایکی موسا علیه السلام وحی بۆکرابوو کە موسا علیه السلام سەرەنجامی چی دەبێ و چۆن دەبێ نەوەک ببێتە مناصرێکی طاغوت بەڵکو دەبێتە نێردراوێکی الله سبحانه وتعالى، جا ئەم بەسەر هاتەی دایکی موسا هیچی بۆ ئەم باسە تێدا نیە و نابێتە بەڵگە بۆ خاوەن گومان.

## گومانی دووەم

دەڵێن: پێغەمبەر یوسف علیه السلام وەزیر بوو یارمەتی دەسەڵات و خەڵکەکەی دەدا بەو پیشەیەی خۆی کە دەیبرد بەڕێوە و مامەڵە بوو لەبەینیان.!!

لە وەڵامیاندا بە پشتیوانی الله تعالی دەڵێن: ئەم باسەی پێغەمبەر یوسف علیه السلام لە حاڵەت و بارودۆخی ئاشتیخوازی دا بووە و هیچ جەنگێک نەبوە و نەکراوە دژ بە موسڵمانان بەڵکو پشتیوانیشیان کراوە، بەشێوەیەک الله تعالی تمکینی پێدابوو بە سببی ئەوانەوە، هەر وەک و دەفەرموێت:(وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الْأَرْضِ)[یوسف/٥٦]واتە: بەم شێوەیە دەسەڵاتمان بە یوسف دا لەسەر زەوی و جێگیرمان کرد؛ بەڵێ دەسەڵاتی بەشێوەیەک بوو پێچەوانەی حوکم و دینی پادشای دەکرد لە حوکم دا بێ ئەوەی هیچ دژایەتیەکی بکرێت، هەر وەک و الله تعالی دەفەرمووێت:(مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ)[یوسف/٧٦] واتە: ئەم گرتنەی پێغەمبەر یوسف علیه السلام کردی لە دینی پادشا دا نەبوو؛ بەڵێ پێغەمبەر یوسف براکەی دەست گیر کرد بەڵام ئەم کارەی لەدینی پادشا نەبوو و ڕێگا دراو نەبوو لە گەڵ ئەوەشدا پادشا دژی پێغەمبەر یوسف علیه السلام نەوەستایەوە بەڵکو دەسەڵاتیشی پێ دا. جا بەم شێوەیە باسەکە ڕوونە، وە ئێمە بۆیە لەسەرەتا باسمان لە ڕێگاپێدراوی مامەڵەکردن لە کاتی ئاشتیدا کرد لەو نێوانەدا بۆ ئەوەی ئەم باسە جیا بکرێتەوە تێکەڵ نەکرێت، باسەکەی ئێمە لە سەر

كەسانێكە كە جەنگاوەر و حربیین و مامەڵە كردن لەگەڵیاندا لەو شتانەی هێزە بۆیان لەسەر موسڵمانان، نەوەک لە حاڵەتی ئاشتیدا و كوفر پشتگیر و هاوكاری موسڵمانان بێت، ئەم قیاسەی كە بۆ ئەم باسە كراوە زۆر لەیەک دورن و قیاسێكی باطڵە.

## گومانی سێیەم

هەندێ كەس ڕادەبی فێڵ لە نەفس كردنەكەی بەشێوەیەک زیاد دەكات تا وای لێ دێت بڵێت: باشە خۆ من نەچومە بۆ مەیدانی جەنگ و لەوێدا خواردنم بۆیان بردبێ یان ئامێرەكانیانم چاک كردبێتەوە یان چارەسەرم پێدابن ...،كەوایە من فرۆشتن و مامەڵە لە دوكانەكەم یان لەشوێنی پیشەكەم بكەم لە گەڵ هەر كەسێک بێت ئەو كەسە بە ئاشتیخواز حیساب دەكەم بەرامبەر موسڵمانان بە هەموو شێوەیەک.

لە وەڵامی ئەو كەسانەدا دەڵێین: تەقوای الله تعالى بكەن و بیربكەنەوە و هۆشتان بێنەوە سەرەخۆتان، مەگەر نازانن و نابینن و نابیستن پێشمەرگە تا لە ژێر ناوی پێشمەرگە بێت ئاسایش تا لە ژێر ناوی ئاسایش بێت دژە تیرۆر تا لە ژێر ناوی دژە تیرۆر بێت ئەوا دایمە لە ئامادە باشی دان، ئەزانن بۆ چی؟، بۆ بەرەنگار بونەوەی هەموو موسڵمانێک كە بانگەوازی توحید بكات بۆ هەموو موسڵمانێک كە داوای حوكمی قورئان بكات بۆ هەموو موسڵمانێک كە جێبەجێی حوكمی الله تعالى بكات وە لە بەرامبەردا پارێزگاری لە هەموو سەركردە طاغوتیەكانیان بكەن وە هەموو یاسا طاغوتیەكەیان وە هەموئەو جێبەجێ كارانەی كە پێی ڕازین.، داماو بیربكەرەوە و چاوت بەڕووی حەق دا

بکەرەوە، چی تۆی وا کوێر کردوە چی تۆی وا کەڕ کردوە چی دڵی ڕەش کردوی تا تێنەگەی، مەگەر نازانی تا بارەگا و مەقەڕەکانیان مابێت ئەوانە لە هەموو شوێنێ جەنگاوەرن مەگەر نازانی تا یەک موسڵمان لە سەر توحید و جیهاد لە زیندانەکانیان مابێت ئەوانە جەنگاوەرن لە هەموو شوێنێک، ئەم باسانە لای هەموو کەسێ ڕوون و ئاشکران و هیچ یەکێک نییە بەم باسانە ئاگادار نەبێت و بێ ئاگا بێت لێی. (پەنا دەگرین بە الله تعالی لە کوێربون لە ئاستی حەق)

## گومانی چوارەم

گومانێکی تر کەوا لای هەندێ کەس باوە و دەوترێتەوە و دەڵێن : باشە پێشمەرگە و فلان و فلان زۆرینەیان ئێستا هەر بۆ پول و پارە ئەم کارە دەکەن، ئەم کابرایە ناچارە خاوەن عائیلە و چەند منداڵی هەیە، باشە لە گەڵ ئەوەی حوکمی کوفر هەر دەیگرێتەوە، بەڵام خۆ ئەو کەسە بەدڵ لە گەڵ کارەکەیاندا و نییە و دژی موسڵمان نیە، ئایا مامەڵە لە گەڵ ئەو کەسەدا لەو شتانەی یارمەتیە لەسەر موسڵمانان ئایا هەمان حوکمە لە گەڵ ئەوانەی تردا؟!.

لە وەڵامی ئەم ووتەیەدا دەڵێین: گەر بگەڕێنەوە سەر هەموو باسەکە، لە بەڵگەکان و لە هەموی باس لە باسی کار و کردار بووە نەوەک و دڵ، تا بگەڕێنەوە سەر دڵ و بڕیاری لێ دەن و مامەڵەیان لە گەڵ بگونجێنن، نا نەخێر کێشەی ئەم باسە ئەوەیە کردارە بە کردار هاوبەشن لە جەنگی موسڵمان و بەرگری لە طاغوت دەکەن، نیەتی دڵیش نابێت بە عوزر بۆی، نە

بۆ حوكمی خۆی وەبۆ حوكمی یارمەتی دەرو هاوكارەكەی، چونكە لە كردار دا هاوكاریان بوە و لە گەڵیاندابووە، هەر وەک و بەسەر هاتی عباسی مامی رسول الله صلى الله عليه وسلم، كاتێ لە جەنگی بەدری پیرۆزدا مامی رسول الله صلى الله عليه وسلم عباس بە دیل كەوتە لای موسڵمانان، جا دوای ئەوەی رسول الله فەرمانی دا دیلەكان بە ماڵ و فیدیە ئازاد بكات، بە عباسی مامی ووت كە فیدیەی خۆی و هەردوو برازا و هاوپەیمانەكانی بدات، عباسیش بە رسول الله صلى الله عليه وسلم ی ووت بەزۆر منیان هێناوە بۆ جەنگ گەرنا من موسڵمان بوم و بەویستی خۆم نەهاتوم، بەڵام رسول الله ئەم عذرەی لێ قەبوڵ نەكرد، بەهۆی ڕوكەشی كردارەكەی و بەژداربونەكەی .

بەڵێ ظاهیری و ڕواڵەتی كارەكان ئەحكامەكانی ئەم باسەی لەسەر دادەمەزرێ نەوەک و دڵ تا خۆت بخەیتە گومان لەوەدا.

# لە كۆتایدا

ئامۆژگاری و یادی نفسم دەخەمەوە پاشان ئێوە بە تەقوای الله تعالی، وە الله تعالی دەفەرموێت:(**إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا**)[الكهف/٧] واتە: ئێمە لەسەر زەویدا زینەت و ڕازاوەیەكمان بەسەرا داوە بۆ ئەوەی تاقیان بكەینەوە كێ كاروكردەوەی چاكتر ئەنجام ئەدات؛ وە رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: **ئەم دونیایە سەوزایی و جوانییە و الله تعالی ئێوەی تێیدا جێنشین كردوە سەیرتان دەكات چ كارو كردەوەیەكی تێدا دەكەن**؛ بەڵێ ئا ئەمە دونیایە، و لەبەردەممانە بە زینەت و ڕازاوایی و خۆشی جا كێ هەیە ڕێگای ڕزگاری بگرێتە بەر و دەست بە كردەوەی چاكە بگرێ، لەوەی خۆی لە قەدەغەكراوەكان بپارێزێ و لە الله تعالی بترسێت، جا كێ هەیە گوێ بە ناخۆشی و برسیێتی و ئازار و ناڕەحەتی نەدات لە پێناو پاراستنی دینەكەی، كێ هەیە دوارۆژی لە بیردایە و دونیایی لە یاد چۆتەوە، كەسی ڕاستگۆ كاتێ حاڵی پیشەیەكی كوفری یان حەڕامكراوی بۆڕون ببێتەوە هەرگیز گوێ بەوە نادات ئاخۆ توشی چ بەڵایەك و برسیێتی و دەردەسەریەك دێت هەرگیز ڕێگا بە نفسی نادات فێڵ لەخۆی بكات و بكەوێتە دوای بەهانەی باطڵەوە، رسول الله صلی الله علیه وسلم دەفەرمووێت:(**ئاگری جەهەنەم بە شەهەوات و ئارەزواتەكانەوە دەور دراوە، وە بەهەشت بە زەحمەتی و ناخۆشیەكان دەور دراوە**)[بخاري/٦٤٨٧]، كۆتایی پێ دێنم بە ئامۆژگاری رسول الله صلی الله

عليه وسلم بۆمان، کاتێ حذیفەی کوڕی یمان -رضي الله عنه- پرسیاری شەڕ و فیتنە لە رسول الله دەکات و رسول الله صلى الله عليه وسلم بۆی وەسف دەکات، جا حذیفە دەڵێت: ئەی رسول الله صلى الله عليه وسلم گەر کەوتمە ناو ئەم فیتنەیە چیم فەرمان پێ دەکەی؟، رسول الله صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو:( **لەو کاتەدا پەیوەست بە ئیمامی موسڵمانان و کۆمەڵەی موسڵمانان**) حذیفە ووتی: ئەی گەر لەو کاتەدا نە ئیمام و نە کۆمەڵەی موسڵمانان نەبوو چی؟، رسول الله صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو:( **دوربکەوە لە هەموو لایەنێک، گەر بە گازگرتنیشت بێت لە قەدی دارێک تا مردن پێت دەگات و تۆش هەر لەسەر ئەوە مابویتەوە[پاکیت لە کەوتنە فیتنە]**)[صحیح البخاري/٣٦٠٦]

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين**